زنجیرەی چیرۆکە قورئانیەکان
(5)

# گوێرەکە ئاڵتوونییەکە



منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

ن/ مسعود صبري
و/ زانا کريم

زنجیره چیرۆکه قورئانیەکان

(٥)

# گوێرەکە ئاڵتونییەکە

ن/ مسعود صبری

و/ زانا کریم

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی زنجیره: زنجیرەی چیرۆکە قورئانیەکان
ناوی پەرتوک: گوێرەکە ئاڵتونییەکە
نوسینی: مسعود صبری
وەرگێڕانی: زانا کریم
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
تایپ و دیزاین: کۆمپیوتەی یاد
ژمارەی سپاردن: ژمارەی (١٣٨٠)ی ساڵی (٢٠٠٩)
لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی (مەحوی)
هەولێر/ بازاڕی رۆشنبیری

مافی چاپ پارێزراوە بۆ وەرگێڕ



بسم الله الرحمن الرحيم

## دەستپێک

لـە ژیـانی هـەر یـەکێ لـە پێغەمبەرانـدا مەشـهەد و ڕوداوی هەمەجۆر و سەیر هەیە کە مرۆڤ دەتوانێت لـە ڕێیـەوە سروشـتی گەلانی پێشوو بناسێت و بیانخوێنێتـەوە و بزانێـت تـا چـەندێکیش ئەو خەڵەکە بە گـوێی پێغەمبـەرەکانیان کـردووە و شـوێنکەوتەیان بوون، وە مـرۆڤ دەتوانێـت لـە ڕێـی چـیرۆکەکانیانەوە دڵسۆزی و خەمخۆری ئەوانی بۆ ئاشکرا ببێت بۆ نەتەوە و گەلەکانیان.

چـیرۆکی گوێرەکەکـەی نەتـەوەی ئیـسرائیلیش یەکێکـە لـە چیرۆکەکانی نێو قورئـانی پـیرۆز، ئـەم بەسـەرهاتە لـە سـەردەمی پێغەمبەر موسای کوڕی عیمراندا ڕوی داوە اسلاوی خـوای لەسـەر بێـت) لە پاش خنکانی فیرعەونی ستەمکار و هاوەڵانی..

ئەم چیرۆکە قسە دەکات دەربارەی هاوەڵ دانان بـۆ خـودای تاقانە، کاتێ کـە ئـەوە بـوو لـەو نەتەوەیـەدا پیاوێـک هەسـتا بـە دروسـتکردنی گوێرەکەیـەکی ئـاڵتون و خەڵکیـشی بـانگ کـرد بـۆ پەرستنی و ئەوانیش بە گوێیان کرد و هاوبەش و هاوەڵیان بۆ خـوا بڕیاردا.

لــەم پەڕتوکــەدا گەشــتێک دەکــەین بــە نــاو چـیرۆکی ئــەو گوێرەکەیەدا، وە بـزانین کـاتێ کـە خەڵکەکـە کردیـان بـە خـوا و

دەیانپەرست هەڵوێستی پێغەمبەر موسا سڵاوی خوای لێ بێ چۆن بوو؟..

پەروەردگارمان پێغەمبەرانێکی زۆر زۆری ناردووە بۆ نەتەوەی ئیسرائیل کە بە ناو بانگترینیان موسایە سڵاوی خوای لێ بێ، کاتێ کە پەروەردگار موسای کرد بە پێغەمبەر ئەو خەڵکە لە ناو شاری میسردا دەژیان و ژیانیان دەبردە سەر، پاشا و حاکمی ئەو خەڵکەش کەسێکی زۆر ستەمکار و دڵڕەق و خوانەناس بوو کە ناو دەبرا بە فیرعەون، خەڵکی زۆر ئازار دەدا و هیچ ڕەحم و بەزەییەک لە دڵیدا نەبوو، بە ئارەزووی خۆی خەڵکی دەکوشت و ڕای دەبوراد و خۆی بە گەورە دەزانی و تەکەبووری بەسەر ئەو خەڵکە هەژار و لاوازانەوە دەکرد، تا خۆبەزلزانییەکەی ئەوەندە زۆر بوو کە فەرمانی کرد بە خەڵک کە بیپەرستن و کڕنوش و سوجدەی بۆ ببەن، وە دەیووت من خوای ئێوەم، ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾ النازعات (٢٤)

واتە: من پەروەردگاری هەرە بەرز و بڵندی ئێوەم.

ئەو خەڵکە داماوەش زۆرێکیان قەناعەتیان وابوو، کە بەڵێ فیرعەون خوای جیهانەکانە و هەر ئەوە باران دەبارێنێت و خەڵک دەمرێنێت و دەژێنێت و سود و زیان دێنێتە ڕێی ژیانی خەڵکی..

بەنی ئیسرائیلیەکان لە نـاو میـسردا زۆر دەچەوسـێنرانەوە و ئازار دەدران، کاری زۆر نەشیاو و نەگونجاویان پێدەکرا و بایەخیان پێ نەدەدرا، کوڕەکانیان دەکوژرا و کچەکانیـشیان دەهێـشتەوە بـۆ خزمەتکردن و ڕابواردنی خۆیان، لەبەر ئەوەی بەنی ئیسرائیلییەکان لە ڕەچەڵەکدا لە بنەماڵەی فیرعەون نەبوون..

پێغەمبەر موسای دڵسۆزیش سلاوی خوای لێ بێ کاتێ کە ئـەم شتانەی بینی چوو بـۆ لای فیرعـەون و پێـی ڕاگەیانـد: وازبێنـە لـە ستەمکاری و چیتر ئەو خەڵکە هـەژارە مەچەوسـێنەرەوە و تـۆ هـەر ئەوەندەی کـە بەنـدەی خوایـت و پێویـستە لـە سـەرت کـە خـوا بپەرسـتیت و واز بهێنیـت لـە زوڵـم و زۆرداری، وە لێگـەڕێ لـەو خەڵکەش با بەتەنهایی خوای جیهانەکان بپەرسـتن و خـۆت بـە خـوا مەزانە بەسەریانەوە و چیتر ستەمیان دەرحەق مەکـە و مافـەکانیان بدەرێ و مافیان پێشێل مەکە..

بەلام فیرعەونی زاڵم گاڵتەی دەهات بەو قسە جوانانەی موسا و ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر خۆی بە گەورە دەزانی و زیاتر خەڵکی دەچەوسانەوە.. ڕۆژێکیان لە کۆشکەکەی لەگەڵ سەربازەکانیدا دەرچوو بۆناو خەڵکی، کاتێ کە گەیشتە ناو خەڵکەکە زۆر بە خۆبەگەورە زانین و بە فیزەوە وتی ﴿أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَـٰذِهِ ٱلْأَنْهَـٰرُ تَجْرِى مِن تَحْتِىٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ الزخرف «٥١»

واتـــه: ئـــەی قـــەوم و گەلەکـــەم، مـــن پاشـــای میـــسرم و فەرمانڕەوای ئەم ولاتەم، ئەم ڕوبارانەش بـە بـەر کۆشـکەکانماندا دەڕوات، ئایا ئەم دەسەلاتەی من نابینن.

ئەوسا دەیویست لەناو خەلکەکەدا موسا بشکێنێت و وای لێبکات کە خەلکی لێی نزیک نەکەونەوە و گوێ بۆ قسە حەق و ڕاستەکانی نەگرن، بۆیە وتی ﴿أَمۡ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٞ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ﴾ الزخرف (٥٢)

واتە: بەلکو نابینن من چاکترم لـەو کەسـەی ناوبـانگی نییـە و کەسایەتیەکی لاواز و نەناسراوە و زمان پاراو نییە و لەوانە نیە کـە بتوانێت چاک خەلکی تێگەیەنێت.

وە وا گومانی دەبرد ئەگەر موسا پێغەمبەر بوایە دەبوو زۆر دەوڵەمەند بوایە و فریشتەش لە کارەکەیدا یارمەتی بدایە و بەڕاستیان بزانیایە، بۆیە بە خەلکەکەی دەوت ﴿فَلَوۡلَآ أُلۡقِيَ عَلَيۡهِ أَسۡوِرَةٞ مِّن ذَهَبٍ أَوۡ جَآءَ مَعَهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مُقۡتَرِنِينَ﴾ الزخرف (٥٣)

واتە: جا ئەوە بۆچی بازنی ئالتون و زێڕی پێشکەش ناکرێت (تا نیشانە بێت بۆ پایەداری) یان ئەوە بۆ فریشتە لەگەڵیدا نەهاتن بـۆ بانگەوازکردن و پشتیوانی لێکردنی؟!

ئاوا بەم شێوەیە عەزیەت و ئازاری بەنی ئیسرائیلیەکانی دەدا تاوەکو ئیمان بە خوا نەهێنن و شوێنی پێغەمبەر موسا نەکەون..

کاتێ کە ڕۆژ بە ڕۆژ ستەمکارییەکانی فیرعەون زیادی دەکرد و توندڕەوتر دەبوو بەرامبەر بە خەڵکەکە، خەڵکەکەش چوونە لای موسا و وتیان: ئەی موسا، ئەی نێردراوی خوا، ئەی دڵسۆز و میهرەبان، فریامان کەوە و لەدەست ئەم ستەمکار و دیکتاتۆرە ڕزگارمان بکە؟

پێغەمبەر موساش سڵاوی خوای لێ بێت، داوای لە خوای گەورە کرد کە بێت بە هانای ئەم خەڵکەوە و لە دەستی ئەم ستەمکارە ڕزگاریان بکات، فەرمان لە لایەن خوای کاربەجێوە هاتوو فەرمان کرا بە موسا کە خۆت و هەموو بەنی ئیسرائیلیەکان شاری میسر جێ بهێڵن و کۆچ بکەن، موساش هەواڵەکەی بە خەڵکەکە ڕاگەیاند و ئەوانیش زۆر پێیان خۆش بوو.

ئەوسا لە شەوێکدا بە نهێنییەوە هەموو ماڵ و سامانەکانیان پێچایەوە و کەوتنە ڕێ تا گەیشتنە نزیک دەریای سور، پاشان گوێیان لە قرە و هاوار بوو، کاتێ کە ئاوڕیان دایەوە بۆ دواوەی خۆیان بینیان کە فیرعەون و سەربازەکانی هەموویان وا بەرەو ڕوویان دێن، خەڵکەکە زۆر ترسان و چاوەکانیان ئەبڵەق بوو، ڕوویان کردە موسا و وتیان: ئەی موسا تازە ئەوە هاتن و ئێستە جارێکی تر

دەمانگێڕنەوە بەرەو میسر و لە جاران زیاتر سزامان دەدەن و دوریش نیە نەمانکوژن؟، موسا هیچ نەدەترسا و زۆر بە ئومێد و هیواوە قسەی دەکرد و بە خەڵکەکەی دەوت مەترسن، بێ ئومێد مەبن و غەمبار مەبن ئێمە خوامان لەگەڵدایە و کۆمەکیمان دەکات، خەڵکەکە هەر دەترسان و هاوار و گریانیان بەرز بوویەوە، موساش زۆر بە متمانەوە پێی دەوتن:

﴿كَلَّآ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ الشعراء (٦٢)

واتە: نەخێر وانییە، من پەروەردگارم لەگەڵدایە و ڕێنمونیم دەکات (بۆ ڕزگاری و سەرفرازی).

## موعجیزەکە

کاتێ کە فیرعەون و سەربازەکانی دەهاتن بەرەو ڕووی خەڵکەکە، پێغەمبەر موسا سڵاوی خوای لێ بێت.، دەستەکانی بەرز کردەوە و داوای یارمەتی و کۆمەکی لە خوا کرد و وتی: خوایە ڕزگارمان بکە لەدەست فیرعەون و سەربازە دڵڕەقەکانی.. پەروەردگاریش فەرمانی کرد بە موسا ئەی موسا دار عەساکەت بکێشە بە دەریاکەدا، ئەو دارەی کە پێشتێستە دەبوو بە مار و ئەژدیها لەبەردەمی فیرعەوندا، ئێستا بە فەرمانی خوداوەند کارێکی تری پێ ئەنجام دەدرێت، موساش گوێڕایەڵی فەرمانەکەی خوای کرد و دارەکەی دا بە دەریاکەدا و یەکسەر بە فەرمانی خوا



ئەو دەریا گەورەیە شەقی برد و (١٢) ڕێگای گەورەی تێدا دروست بوو، تاوەکو بە ئاسانی پێیدا بڕۆنە ئەوبەری دەریاکە وەو ڕزگاریان ببێت، وە بەنی ئیسرائیلییەکان (١٢) کۆمەڵ بوون، موسا فەرمانی پێ کردن هەر کۆمەڵە و لە ڕێگایەکەوە بڕۆن، ئاوا بەم شێوەیە خوای گەورە هێز و دەسەڵاتی خۆی پێ نیشان دان و دەریای لەسەرپێ بۆ راگرتن، پاشئەوەی کە هەموویان پەڕینەوە ئەوبەری دەریاکە، فیرعەون و سەربازەکانی گەیشتنە سەر دەریاکە و ئەو دیمەنەیان بینی زۆر سەرسام بوون، بەڵام هێشتاش هەر بڕوایان نەهێنا و هەر بە هیوای ئەوە بوون کە جارێکی تر ئەوان بهێننەوە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، بۆیە ئەوانیش بەناو ڕێگاکاندا دەستیان کرد بە رۆشتن و وایان دەزانی ئەم ڕێگایانە بۆ ئەمانیشە، تا ئەوەی گەیشتنە لای ناوەڕاستی ڕێگاکان، ئەوسا لە لایەن پەروەردگارەوە فەرمان کرا بە دەریا کە بێتەوە دۆخەکەی جاران و وەکو خۆی لێبێتەوە، پاشان دەریاکەش بە فەرمانی خوداوەند وەکو خۆی لێهاتەوە و فیرعەون و هامان و هەموو دارودەستەکانیانی لول کرد و هەموویان لەناو چوون و خنکان و مردن و هەموو مرۆڤایەتی لەو ڕۆژەوە لەدەست ستەمکاریەکانی ئەوان رزگاریان بوو،

ئەوسا بەنی ئیسرائیلیەکان زۆر دڵخۆش و دڵشاد بوون و زۆر سوپاسی خوایان کرد لەسەر ئەو نیعمەتە گەورە، مرندی فیرعەون و سەرانی ستەمکاری..

# بت پەرستی

پاش ئەوەی پەروەردگاری کاربەجێ فیرعەون و سەربازەکانی لە ئاوەکەدا نوقم کرد و هەموویانی مراند ، بەنی ئیسرائیلییەکان ئاوەکەیان بەجێ هێشت و ڕۆیشتنە، پێغەمبەر موساشیان لەگەڵدا بوو سڵاوی خوای لێ بێت، تا گەیشتنە شوێنێک کە خەڵکی ئەو شوێنە خەریکی بت پەرستی بوون و خوایان نەدەناسی بەنی ئیسرائیلی یەکانیش ، دوای بینینی ئەو هەموو موعجیزە گەورە وسەیرانە چوونە لای موسا و زۆر بە ئاساییەوە بەو پێغەمبەرە دڵسۆز و خەمخۆرەیان وت: ئەی موسا داوا دەکەین ئێمەش خوایەکمان هەبێ و خوایەکمان بۆ دروستبکە هەروەکو چۆن خەڵکی ئەم ناوچەیە خوایان هەیە و کڕنوشی بۆ دەبەن و تەوافی دەکەن!!!

کاتێ پێغەمبەر موسا سڵاوی خوای لێ بێ ئەم قسەیەی لێ بیستن زۆر زۆر توڕە بوو، ئەوسا بە توڕەییەوە بە دەنگێکی زۆربەرز پێی وتن ﴿إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ﴾ الاعراف ١٣٨

واتە: بەڕاستی ئێوە قەومێکن نە دەزانن و نە دەفامن..

ئەوسا موسا ڕووی تێکردن و دەستی کرد بە وتاردان و قسەی جوان و ئامۆژگاری خێر بۆیان و فەرمووی ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٣٩ قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِيكُمۡ

إِلَٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَإِذْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ

ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ

وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾

الأعراف (١٣٩-١٤١)

واتە: بێگومان ئەوەی تێیدا دەژین لەناوچووە و پوچەڵە ئـەوەی ئەوان دەیانکرد.

موسا وتی: ئایا کەی ڕەوایە بێجگە لە خوا خوایەکی ترتـان بـۆ بخوازم، لە کاتێکدا کە ئەو زاتە لەناو خـەڵکی ئـەو جیهانـەدا هـەڵی بژاردوون و ڕێزی زیاتری لێ ناون.

یادی ئەو کاتەش بکەن کە ڕزگارمان کـردن لـە دارودەسـتەی فیرعـەون کاتێـک کـە ناسـۆرترین ئەشـکەنجەیان دەدان، بـە شـێوەیەکی دڕندانـە زۆرینـەی کوڕەکـانی ئێوەیـان دەکوشـت و ئافرەتەکانی ئێوەشیان دەهێشتەوە (بۆ کەنیزەکی)، لەوەشدا بـەڵاو تاقیکردنەوەیەکی گەورە هەیە بۆتان لـە لایـەن پەروەردگارتانـەوە (بۆچی زوو فەرامۆشتان کرد؟).

پاشان خوای گەورە کاتێکی بۆ موسا دیاریکرد تاوەکو گفتوگۆی لەگەڵدا بکات، موساش پێش ئەوەی کاتە دیاریکراوەکە بێت خـۆی زۆر بە چاکی ئامادە کـرد و بـەردەوام بـیری لـە دروسـتکراوەکانی

خوای گەورە دەکردەوە تـاوەکو ڕۆحـی پاڵفتـە و بێگـەرد بکاتـەوە، چونکە دیـدار لەگـەڵ خوداوەنـددا ئاواتێکـە کـە هـەموو مرۆڤێـک تامەزرۆیەتی..

## ئامۆژگاری

کاتێک وەختی دیاریکراو هات تـاوەکو موسـا بـڕوات دیـدار و گفتوگۆ لەگەڵ خوای بالادەست بکات موسا سلاوی خـوای لـێ بێـت ئامۆژگاری هارونی برای کرد کە ئاگای لە ئیمانی ئەوخەڵکە بێـت و ڕێگە نەدات لەناویاندا بت پەرستی و شەڕ و ئـاژاوە و دووبـەرەکی ڕووبدات..

ئەوسا موسا بەسەر کێوەکەدا سەرکەوت بەرەو سەرەوە، زۆر هەستی بە دڵخۆشی و شادمانی و خۆشـنودی دەکـرد، چـونکە ئـەو دەڕوات گفتوگـۆ لەگـەڵ کەسـێکدا دەکـات کـە خـاوەنی هـەموو بونەوەرە و هەر ئەویش بەدیهێناون، تـاوەکو شـەریعەت و یاسـا و ڕێسای ژیانی لەلاوە بهێنێت بۆ ئەو خەڵکە.

## گوێرەکە پەرستی

دوای ئەوەی موسا بەرەو دیداری خوداوەند ڕۆیشت، پیاوێکی بێباوەڕ کە ناودەبرا بە سامیری بە فرسەتی زانی و لەناو خەڵکەکەدا ئاڵتون و زێڕی کۆدەکردەوە ، تائەوەبوو گوێرەکە یەکی لێ دروست کرد، ناوسکەکەی بە بەتاڵی جێهێشتبو، بە شێوەیەک

هەر کاتێک هەوا بەناویدا بڕۆشتایە لە دەمیەوە دەنگێک دروست دەبووو کە هەروەکو دەنگی گوێرەکەی ڕاستەقینە وابوو، ئەوسا بە خەڵکەکەی وت ئەی خەڵکینە ئەمە خوای ڕاستەقینەی ئێوەیە و پێویستە لەسەرتان ئەم خودایە بپەرستن نەک ئەو خودایەی کە موسا بانگەشەی بوونی دەکات، وە پێی دەوتن ﴿هَـٰذَآ إِلَـٰهُكُمۡ وَإِلَـٰهُ مُوسَىٰ﴾ طه (٨٨)

واتە: (سامیری و بێ دینەکان بێ شەرمانە) وتیان: ئەمە خـوای ئێوە و خوای موسایە.

ئەوسا سامیری بە خەڵکەکەی وت: ئەی خەڵکینە بەڕاستی خـوا موسای بیرچۆتەوە و موسای لەبیر نەماوە و موسا ئێستە لەناو ئـەو کەژ و کێوانەدا بە دوای خوادا وێڵە و بەدوایـدا دەگـەڕێت، بۆیـە پێتان ئەڵێم پێویستە لەسەرمان ئەم گوێرەکەیە بپەرسـتین، چـونکە ئائەمەیە خوای ئێمە و خوای موساش.

کاتێ هارون ئەم دیمەنانەی بینی زۆر قسەی بۆ کردن و ئامۆژگاری کردن و دەیفەرموو: ئەی بەنی ئیسرائیل بەقسەیسامیری فریو مەخۆن و هەڵنەخەڵتێن، هەر خوای تاک و تەنها بوو هات بە فریای ئێمەوە و لە دەستی فیرعەونی ستەمکار و سەربازەکانی رزگاری کردین و لەبیری نەکردین، بۆیە دەبێ ئێمەش هەموو کات سوپاسی بکەین و بەندایەتی تەنها بۆ ئەو

بکەین و نابێ لە جێی ئەودا گوێرەکەیەکی ڕەق و تەق و بێ سوود و بێ زیان بە خوای خۆمان بزانین و کڕنوشی بۆ بەرین، وە پێی ڕاگەیاندن کە ئەم گوێرەکە هۆی ئیمتحان و تاقیکردنەوەیە بۆتان و نابێت لەم تاقیکردنەوەیەدا چۆک دابدەن و سەرکەوتوو نەبن، پاشان ئەوە بوو قسەکەی هاروونیان پشتگوێخست، بۆیە هاروونیش پێی وتن ﴿يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوٓاْ أَمۡرِي﴾ طه (٩٠)

واتە: (هارون پێی وتن) ئەی قەومی مـن: ئێـوە بـەم گوێرەکـە زێڕینە توشی تاقیکردنەوەیەکی سەخت بوون و تیایدا دەرنەچوون، دڵنیابن کە پەروەردگارتان خوایەکی میهرەبانە، شوێنی من بکەون و گوێڕایەڵی فەرمانی من بن.

بەڵام خەڵکەکە هیچ گوێیان نەدا بە قسە بەرزەکانی هارون و پێیان وت ﴿قَالُواْ لَن نَّبۡرَحَ عَلَيۡهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرۡجِعَ إِلَيۡنَا مُوسَىٰ﴾ طه (٩١)

واتە: وتیان: هەرگیز وازی لێ نـاهێنین و بەدەوریـدا دێـین و دەیپەرستین هەتا موسا خۆی دەگەڕێتەوە.

# ڕازونیازەکە

کاتێ موسا لە گەڵ خودا گفتوگۆی دەکرد خوای گەورە هەواڵی گوێرەکە زێڕینەکەی دا بە موسا کە سامیری دروستی کردبوو تاوەکو خەڵکی بیپەرستن و ئەوە بوو ئەوانیش بە گوێیان کرد و پەرستیان..

پاشان کە موسا گفتوگۆ و راز و نیازەکانی لەگەڵ خوداوەند کۆتایی پێهات و تەواو بوو، ئەو پەیمانەی لەگەڵ خۆی هەڵگرت کە شەریعەت و ڕێسای ژیانی نەتەوەی ئیسرائیلی تیا بوو، ئەوسا زۆر بە پەژارە و تووڕەییەوە گەڕایەوە بۆ ناو قەوم و گەلەکەی، هەر کە گەیشتەوە ناو خەڵکەکە و گوێرەکەکەی بینی زۆر بە تووڕەییەوە پەیامەکانی فڕێدایە سەر زەوی و بە خەڵکەکەی وت: ئایا پەیمانی سەرکەوتنمان لە لایەن خواوە پێ نەدرا کە بچینە ناو خاکی قودسەوە و سەرکەوین بەسەر نەیارەکانماندا، باشە ئێوە بۆچی ئەو پەیمانەتان لەیاد کرد و بۆچی وا زوو خواتان لەبیر کرد و هاوەڵ و هاوبەشتان بۆ بڕیاردا؟

لەباتی ئەوەی داوای ڕەحمی خوابکەن دەتانەوێت بەهۆی ئەم بتانەوە سزا و خەشمی خوا بۆ خۆتان مسۆگەر بکەن؟

خەڵکەکە زۆر داوای لێبوردنیان لە موسا کرد و بەهانەیان بەوە هێنایەوە کە سامیری ئەم کارەی پێ کردوین.

## سەرزەنشت

پاشان موسا ڕووی کردە هارونی برای و زۆر بە تورەییەوە قژی هارونی برای گرت لەگەڵ ریشیدا و، بە هاروونی وت: بۆچی هێشتوتە ئەم خەڵکە واز لە پەرستنی خودا بهێنن و دەست بکەن بە پەرستنی بت و پەیکەر، بۆچی ڕێگەت لێنەگرتن و قەدەغەت لێ نەکردن ؟ هارونیش زۆر بە نەرم و نیانی و لەسەرخۆییەوە بە موسای برای وت ﴿يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِيٓ إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي﴾ طه (٩٤)

واتە: کوڕی دایکم (بۆ ئەوەی سۆزی بجوڵێنێت) ڕیشم مەگرە و قژم ڕامەکێشە ، (من بۆیە زۆر لەسەری نەچوم) بێگومان ترسام دوایی پێم بڵێیت: تۆ جیاوازیت خستە ناو نەوەی ئیسرائیلەوە و گوێت بە قسەی من نەدا.

پێغەمبەر موسا سڵاوی خوای لێبێ بە قسەکانی هاروونی برای هێور بوویەوەو بێدەنگ بوو، پاشان لە بەرامبەر خوای گەورەدا زۆر هەستی بە شەرمەزاری دەکرد، بۆیە بە نزا و پاڕانەوە رووی کردە پەروەردگار و فەرمووی: ﴿رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَلِأَخِي وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ الاعراف (١٥١)

واتە: (ئەوسا ئیتر موسا بە خۆیدا هاتەوە)و وتی: پەروەردگارا لەخۆم و براکەشم خۆش ببە و هەردوکمان بخەرە نێو رەحمەت و میهرەبانی خۆتەوە و تۆ لە هەموو کەس بەسۆزتر و میهرەبانتریت.

سامری ئەو کەسەی کە گوێرەکەکەی دروستکردبوو، زۆر لە دوری پێغەمبەر موسا وەستابوو بە ترسەوە، چونکە دەیزانی گوناهێکی زۆر گەورەی بەو خەڵکە کردووە، کە ئەوەیش هاوەڵ دانانە بۆ خوا، وە دەیزانی کە پێغەمبەران سڵاوی خوایان لێ بێ زۆر رقیان لەم کردەوەیە و پێیان ناخۆشە،

ئەوسا موسا رویکردە سارمری و بە توڕەییەوە پێ فەرموو:

﴿فَمَا خَطْبُكَ يَـٰسَـٰمِرِيُّ﴾ طه (٩٥)

واتە: ئەی کارە خەتەرناکە چییە کە ئەنجامت داوە، (ئەم پیلان و تەڵەکە و فێڵە چییە دروستت کردووە)؟!

-کێ وای لیچ کردی ئەم کارە بکەیت ئەی سامری؟

سامریش چیرۆکی دروستکردنی گوێرەکەکەی بۆ گێرایەوە و ئەوسا وتی: ئەی نێردراوی خوا نەفسم ئەم کارەی پێ کردم و.. پاشان پێغەمبەر موسا سڵاوی خوای لێبێ فەرمانی کرد بە هەموو خەڵکەکە کە هیچ کەسێک نابێت قسەی لەگەڵ بکات، وە

فەرمانیشی کرد بە سامریش کە بۆت نییە لەگـەڵ هـیچ کەسـێکدا بدوێیت و قسە بکەیت، پاشان دوعای لێکرد و فەرمووی:

﴿فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ﴾

طه ٩٧

واتە:دەبرۆتامـاوی لەژیانـدا (هەرکەسـێك نزیکـت کەوتـەوە دەبێت ) بڵێـت: بـەهیچ شـێوەیەك بەریەککـەوتن نـی یـە (دیـارە کەدەستی هەرکەسی بەرکەوتبێت تووشی ئازارێکی زۆربووە).

ئەوسا موسا هەواڵی ئەوەشی پێدا کەئەمە تەنها سزای دونیایە وسزای سەخت ترت بۆ ئامادەکراوە لەرۆژی قیامەتدا ،پێی ووت:﴿وَإِنَّ لَكَ مَوعِداً لَّن تُخْلَفَهُ﴾ طه ٩٧

واتا:دڵنیابەش بەکەکاتێکی تریشت بۆ دیاری کراوە، کە هەرگیز ناتوانێت لێی دەربازببیت .

پاشان موسا ڕویکردە گوێرەکە ئاڵتونییەکە و بە سامیری ووت:﴿وَانظُرْإِلى إِلَهِكَ الذي ظَلْتَ عَلَيهِ عاكِفاًلَّنُحَرِقَنَّهُ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُ في اليَمِ نَسْفاً﴾ طه ٩٧

واتە:سەرنجی خواکەشت بدە کەبە دەوریدا دەسوڕایتەوە و دەتپەرست ، دەبێت بیسوتێنیت و هەلاهەلای بکەین وبیخەینە ناودەریاوە.

ئەوە بوو پێغەمبەر موسا سلاوی خوای لیٚ بیٚ گوێرەکەکەی لەناوئاگرەکەدا سوتاندو پارچەپارچەی کردو پارچەکانیشی فرێدایەناودەریاوە ، پاشان جارێکی تر ئامۆژگاریکردن و ئاگاداری کردنەوە وپێی ڕاگەیاندن وفەرمووی:﴿إِنَّمَا إِلَٰهُكُمُ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَسِعَ كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ طه ۹۸

واتە: خەڵکینە ئێوە دڵنیابن کەپەروەردگارتان تەنهازاتی (اللّه) یە، جگە لەو خوا یەکی ترنیە ، زانیاری و زانستی ئەوزاتە هەموو شتێکی گرتوتەوە.

پاشان خەڵکەکە کەزانییان کەبەڕاستی وابوو کە ئەوگوێرەکەیە هیچ خێرو زیانێکی بەدەست نەبوو وە خوانە بوو بەڵکو تەنها پارچەیەك ئاڵتون بوو هیچی تر ، بۆیە ڕویان کردە موسا و وتیان : ئەی موسا ئەی نێردراوی خوا داوام بۆ بکە لە خوا کەلێمان خۆش ببێت و تەوبەو پەشیمانیمان لیٚ قبولٚ بکات ؟ موسای خەم خۆریش سلاوی خوای لیٚ بیٚ ڕویکردە پەروەردگار ووتی : ئەی پەروەر دگارا ئەمانە پەشیمانن لەو کردەوەیەی کەکردیان و لەجیاتی پەرستنی تۆ گوێرەکەیان پەرست ، وەئێستەش داوات لێدەکەن کەلێان خۆش ببیت و تەوبەیان لیٚ قبولٚ بکەیت .......؟

پەروەردگاریش وەڵامی موسای دایەوە و فەرمووی : تەوبەیان لیٚ قبولٚ دەکریٚ بەمەرجیٚ ئەوانەیان کە لە جیاتی پەروەردگاریان گوێرەکە یان پەرستووە خۆیان بکوژن ، موساش ئەم هەواڵەی خوای

کاربەجێی پێ ڕاگەیاندن و پێی فەرموون ﴿يَقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُمْ بِاتِّخَاذِكُمُ الْعِجْلَ فَتُوبُوا إِلَى بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾ ٥٤

واتە : ئەی قەوم و هۆزەکەم بەراستی ئێوە بەو گوێرەکە پەرستی یە ستەم تان لەخۆتان کردووە ، دەی بگەڕینەوە بۆلای بەدی هێنەرتان و تەوبە بکەن و ئینجا خۆتان بکوژن (بێتاوان تاوان بار بکوژێت )، ئەوە باشترە بۆتان (چونکە تاوانە کەتان زۆرگەورەیە ) پاشان ئەویش (واتە خوا دوای لەناوبردنی هەندێک لەتاوان باران ) تۆبەی وەرگرت (لەوانەی مابوون ) لەڕاستی دا تەنها ئەوزاتە هێجگار تەوبە وەرگرو بەرەحم و دلۆڤانە .

بەم شێوەیە لەبەردەم ئەوکەسانەدا کەگوێرەکەکەیان پەرستبو هیچ ڕێگایەکی تر نەما ، تەنها ئەوەنەبێت کەخۆیان بکوژن .

لەشەوێکی زۆرلێڵو دژوارو تەمو مژاویدا ئیماندارەکانی ناو نەوەی ئیسرائیل هەستان و شمشێرە کانیان هەڵگرتوو هەمووئەو کەسانەیان کوشت کەلەجیاتی خوای گەورە گوێرەکەکەیان پەرستبو ، ئەمە بو پاداشتی ئەوانەی کەغەیری خوایان بەخوا زانیو کڕنوشو سوجدەیان بۆبردن ...

پەروەردگارا : بۆ خاتری ناوە جوان و سیفەتە بەرزەکانت ، بۆ خاتری ئیسمی ئەعزەمت ، بۆ خاتری گەورەی و ڕەحمان و ڕەحیمی خۆت ، ئەوڕەحمەتەت کەهەموو شتێکی گرتوتەوە و گوناهەکانی

ئێمە لەچاو یدا زۆر بچوکترە لەمیسقاڵێکیش ، ڕەحممان پێبکەو لێمان خۆش ببەو لەڕیزی خۆشەویستانی خۆتدا ژمارمان بکە .

خوایەگیان لەگوناهی مامۆستاکانمان و دایك و باوکیشمان خۆش ببەو هەمووومان لەناو بەهەشتی بەریندا لەخزمەتی پێغەمبەراندا سلاوی خوایان لیّ بیّ کۆبکەرەوە ....آمین..آمین

وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ

٢٠٠٩/٥/٢

والسلام علیکم

# زنجیرەی چیرۆکە قورئانیەکان

1- کەشتی ڕزگار بوون   چاپ کراوە

2- ووشترە خواییەکە   چاپ کراوە

3- یارانی ئەشکەوت   چاپ کراوە

4- گەنجینەکانی قاروون   چاپ کراوە

5- گوێرەکە ئاڵتونیەکە   چاپ کراوە

6- کێوە باڵگرتووەکە

7- خاوەن فیلەکان

8- پەپوی چاکەکار

9- خوانە ئاسمانیەکە

10- مانگا سەیرەکە



چاوەڕوانی بەشەکانی تری ئەم زنجیرە یەبن .

انشاءالله

ئێمەش چاوەڕوانی دوعای خێرتانین .

# زنجیرەی چیرۆکە قورئانیەکان

١- کەشتی ڕزگار بوون چاپ کرا

٢- ووشترە خواییەکە چاپ کرا

٣- یارانی ئەشکەوت چاپ کرا

٤- گەنجینەکانی قاروون چاپ کرا

٥- گوێرەکە ئاڵتونیەکە چاپ کرا

٦-کێوە باڵگرتووەکە

٧-خاوەن فیلەکان

٨-پەپوی چاکەکار

٩-خوانە ئاسمانیەکە

١٠-مانگا سەیرەکە

---

**چاوەڕوانی بەشەکانی تری ئەم زنجیرەیە بن**

**ئیمەش چاوەڕوانی دوعای خێرتانین.**

**E-mail-faqezana@yahoo.com**

